# یەک ...

# لە پەنا خاڵ و سیفری بێ بڕانەوە

نوزاد


نووسینی: دکتۆر عەلی شەریعەتی

وەرگێڕانی: هەژار موکریانی



التفسیر

١٤٢٥ هەولێر ٢٠٠٤

نـاوی کتێـــب: یەک لە پەنای خاڵ و سیفری بێبڕانەوە
نـاوی نوســەر: دوکتۆر عەلی شەریعەتی
نـاوی وەرگـێڕ: هەژار موکریانی
بڵاوکردنــەوەی: نوسینگەی تەفسیر / هەولێر
خـــــەت: نەوزاد کۆیی
وێنەی هێڵکاری (موتیف): دڵشاد عەلی
ساڵی چـاپ: ١٤٢٥ک - ٢٠٠٤ز
تـــیراژ: ٥٠٠٠ دانە
چـــاپکردن: چاپخانەی پەروەردەی هەولێر
ژمارەی سپاردن: (٧٧) ساڵی ٢٠٠٤

تەفسیر
هەولێر - شەقامی دادگا
ت : ٢٢٣٠٩٠٨ - ٢٢٢١٦٩٥
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

موسڵمانانی ڕوناک بیر ، ئەبێ بە شەش ڕاوێژ
دەگەڵ شەش دەستەدا بدوێن :
ڕوناک بیرانی لادەکی ، برایانی هاوئاینمان لە
دەرەوە ، ڕەش و ڕوت شارستانی ، گوندنشینان
چینی ژنان ، تازە لاوان .
ئەم نامیلکە هەروەڵ دەرسە بۆسێ دەستە :
تازە لاوان کەوا تازە بای باڵ دەدەن ، بۆ
ئەو پیاوە زلانەیە کە هەرمنداڵانە دەژین ، بۆ
سەرمەشقی نوسەرانی خۆماڵی یە .

خوێنەری بەڕێز و هێژا

ئیمام عەلی دروودی خودای لە سەر بێ فەرموویەتی :

مەڕوانە ویژەرەکەی بۆوە ، ویژراوەکە بخە بەرچاو . واتا قسەی باش وەرگرە و گوێ مەدە کێ گوتوویەتی .

ئەم نامیلکەی دوکتۆر عەلی شەریعەتی - پێشکەش دەکەین بیخوێنەوە ، وەردی دەوە ، وردی کەوە ، لێی ورد بەوە ، ئەگەر بەهرەی لێ گەیانی و ئیستی باشی لێنگەیانی ، مەڵێ ئاها . بەرهەمەکانی تریشی لە وە خوێنە و بەهرەیان لێ هەڵگرتنە ، دەنا بەو یەکە دازبینەو کەسمان لە کەس .

هەژار

*منداڵەکانمان دەیزانن:*

*پیاوی هەژار، پیاوی بێهێز، با چاکیش بێ، با پاکیش بێ... بەرچاو نیە، نەدار سوکە لەبەر چاوان، ناخرێتە ناو ڕیزی پیاوان، کەس فەقیری پێ پیاو نیە. بەڵام هەر کێ خاوەن زێڕە، خاوەن زۆرە، ئەگەر پیسە، ئەگەر ڕەشە، ئەگەر بۆرە، لەبەر چاوان زل و زۆرە. دەراوی دەمی ناخۆش بێ، دەم پیس بێ، جنێو فرۆش بێ، دەڵێن: پیاوێکی زۆرزانە، لفت خۆش، گفت ڕەوانە، قسەی جوانە، کاری جوانە، شارەزای شارەزایانە!*

*باری گەلانیش هەر واسە:*

*ڕۆژێ کە (ئیسلام) باوی بو، لەناو گەلاندا ناوی بو، زێڕی هەبو، زۆری هەبو، چی بیگوتا هەر ئەوە بو... مامۆستاکانی ڕۆژاوا لە فێرگە، لە زانستگایان، لەناو کۆڕی کەیخودایان. کاریان لاسای موسوڵمان بو، دابی ئەوانیان پێ جوان بو... کەوای شۆڕیان دەبەر دەکرد، عەمامەیان لەسەر دەکرد، ئەدای (رازی) و (ئەبو عەلی) و (دینەوەریان) و (غەزالی) و کێ و کێی دیکەیان دەردێنا...*

*(چۆن ئێستا مامۆستاکانمان کە نەدارین لاسای ئەوان دەکەنەوە، قەرزی کۆنە دەدەنەوە. لە جێژنەدا کڵاوی لەنگەری لەسەر، جبەی قۆڵ فش و فۆڵ دەبەر، ئەدای ڕۆژاوا دەردێنن، ئۆروپاییانە دەنوێنن.)*

دەس ڕەنگینـانی خـاچ پەرسـت، کـە دەسـکردێکیان ڕێـك دەخست، فێڵیان دەکرد:

مۆری (الله)یان لێ دەدا، ڕەنگی (ئیسلام)یان پێ دەدا، تا وا بزانن ئـەو کارانـە، هـی وڵاتـی موسـوڵمانە، کاری (شـام) و (بوخارا)یە، کرگاری (بەڵخ) و (بەغدا)یە، (ئەسـتەنبوڵ)ە، (توسە)، (ڕەیە)، کاری وەستای (غرناده)یە. تەنانەت خاچی گەردن بەند، (الله)یەکیان لێ هەڵدەکەند !

ئەوا ئێستاش لە ڕۆژهەڵاتی بارکەوتو، لەناو گوێچکەی گادا خـەوتو، (مێدیـن) لەدەسـکاریان دەدەن، لاسـای ڕۆژاواییـان دەکەن!

* * *

بو بە شەڕی خاچ پەرستان، دو هۆرد و بەرانبەر وێستان، پێك هەڵپڕژان، تێك هەڵچڕژان... یەکیان گرت خاچ پەرست و حو، ڕێزی دوژمنان پتەو بو... (ئیسلام) لێك جودا بونەوە، بەرەو نەزانی چونەوە، سڕ بون، بونە ماران گەستە، بون بە سەد تیرە، سەد دەستە... تێك بەربون و پێك وەربون، بەجارێك بێ سەر و بەر بون...

(شیعە) و (سوننی)، (تورك) و (عەرەب)، (فارس) و (تورك)، (تورك) و (بەربەر). لە هەمو لایەك بو بە شەڕ... هاودین بە هاودینی دەڵێ: من دادەمەزرێم تۆ هەڵێ!

هەریەك لەوانەش بێکەوە، خۆبەخۆیی، بە نامۆیی، شەڕ و هەراو قیرەیانە، گیرەیانە! هەر لە (شیعە) چەند تیرە هەس، هیچ کەس ناپێوێ بە ڕبەی کەس.

(نیعمەتی)، (صۆفی)، (حەیدەری)، (شێخی)، (ئەمەل)، (باڵا سەری)، (پاین سەری)، یەکێ (دوازدەیی)، یەك (هەشتە)، زۆری دیش هەن، تەنانەت (بابی) و (بەهایی)ش، (عەلی اللهی)ش لە مەیدانا هەرایانە. داوایانە!

(سوننی): چوار مەزەب هەزار توێ، هەموی شیر لە یەکتر دەسوێ، بێ تام و خوێ، (صۆفی)، (دەروێش)، (قادرییە)، (چەشتی)، (نەخشی)، (سۆرەوەردییە)، (نوربەخشی)یە، هەریەکەی چەند لکی هەیە. پێکەوە مشت و مڕیانە، لێکدان و قرەقرپیانە...

جاران حەفتا و دو تیرە بوین، ئێستا لە حەوسەد زیاترین، لە هەمودەم بەرباد ترین، (ئیسلام) گوتی:- خودا یەکە، قورعان یەکە، قیبلە یەکە... کەچی ئێمە هەزار خودا دەپەرستین، بۆیە پەستین، بۆیە بە دژمن ناوەستین. هەزاران ڕوگەمان هەیە.

گۆڕی هەر ئیمام زادەیەك، بارەگای هەر شێخ زادەیەك، شەخص، نەزەرگە، قسنەکۆن، ڕاست یا درۆن، جێ چڵدانەو نیازمانن، پێك هێنەری داخوازمانن! کاولە کۆن، ئێسقانی رزیو، داتەپیو، پواو، هەڵوەریو، لە چۆڵگان، لە دێ لە شاران... بونە جێ هانا و هاواران... چاووڕاوکەرانی دەس بڕ، بە قسەی پڕوپوچ و بن شڕ، خودای پاکیان خودای تاکیان لەبیر کردین، سوژدەیان بۆ خاك پێ بردین! کانگای مێشك و بیریان دەردایین، تێکیان وەردایین، تێکیان بەردایین.. لە بەر شەڕی

خۆبەخۆیی. لەبەر بێڕاهێل و پۆیی... کزبوین، زەبون بوین، تێدا چوین. دەتگوت نەبوین!

(مغول) هات سوتاندی، بردی، کوشتی، کردی، هەرچی کردی. سەرێك ما ئەو سا بۆی دەرچو، دەورانی جەنگیز بەسەر چو. بەڵام ئێمە، ئێمەی خەوخەو، بێهۆش، کە لەلا، رۆژ و شەو، لەسەر (موشتەهید)، لەسەر (شێخ)، لەسەر دەف، لەسەر زەرگ و مێخ، شەرمان، گەرمان ئەنایەوە، ئاورمان نەئەدایەوە.

تا (فەرەنگ) هات، چبوون فەرەنگ؟ مرۆخۆرانی بەرچاو تەنگ، بە فێڵ، بە جەنگ... قاویان کردین، ڕاویان کردین، چاویان بەستین. لەوساوە ناتوانین هەستین! سست و پەستین.

ئێمەی لەگوێی گادا خەوتو، بەسەدەو ساڵ، مانگ و حەوتو، هەر کۆست کەوتو، سەرمان کاسە، هەر نەمان زانی چباسە؟ لەشوێن کۆنەکێلان وێڵین، زورك و ڕەقەنان دەکێڵین، کێشەی کۆنمان ژیاندۆتەوە، تۆوی شەرمان چاندۆتەوە، (با) شەن دەکەین، درۆ دەدروین بەسەر ڕەو بەرەو پاش دەبزوین!

* * *

(فەلە) زل بون، (جو) بو بە شت.. بەشی ئێمەش هەر قت، هەر فت، هەر گزوفت. ئەوان بە پیتۆڵی و گزی، زۆریان هێنا زێرپیان دزی، دژ دامایین بە لەڕی و گزی؛ ناموٚ بونە داگیرکەرمان، پارویان ڕفاند لەبەرمان، بونە (کەیخودا) لەسەرمان، ئەوان (ئاغا)ن ئێمە ژێردەست.. ئەوان دەسدار ئێمە بێدەست، بە عەزرەتەوە دەڕوانین، خۆمان زۆر بە کەم

دەزانـین، (فـەرەنگی) جوانـە، زۆرزانـە، کـەی ئـەو وەکـو مەمانانە؟!

ئێمە چین؟ چینی هەژارین، ئەوان راستن ئێمە خوارین، نالەبارین! (هەژار) زاناش بێ نەزانـە، (دارا) شورەییشی جوانە!

وا بەرەی پێگەیشتومان، بەناخێر تێگەیشتومان، شتی خۆی لەلا دزێوە، هەر لەجێوە، بەسەد شێوە، ئەدای فەرەنگی دەردێنـێ، وە زوان (ئاغـا) ئـەمان دوێنـێ، بۆتـە مـەیمون لاساکەرە، بەلاش گۆشتی سەر چەپەرە!

(ئاغا)ش هەر ئەوەندەی دەوێ، بازاڕی لە بەرەو نەکەوێ! گەرەکیە ئەدای دەربێنین، خۆی چی ئەکا وا بنوێنین. کارەکانمان، شارەکانمان، نوسەرانمان، هۆنەرانمان، پیاوی پیتۆڵ و چازانمان، حاڵمان، باڵمان، ژیانی ناو ماڵ و مناڵمان، ژنمان، پیاومان، گشت و خاومان، تەنانەت لەقەم و ناومان، دەمەلاسکەیەك لەوان بێ، تا کلیلمان هەر بەوان بێ.

بەڵێ داگیرکەرەکانمان، رزق و رۆزی بەرەکانمان، نایانەوێ خۆ بناسین، تا وا کاسین، بۆ وان خاسین! ئەوان دەترسن تێبگەین، لە داو بەربین و پێبگەین.

تا بێ فکر و بیر نەبەرین، تا لەخۆمان بێخەبەرین، بۆ وان مانگاین، ئەسپین، کەرین، بارەبەرین. شیرمان دەخۆن، بارمان دەکەن، سوارمان دەبن، غارمان دەدەن، لەسەد بەرد و دارمان دەدەن...

تا دەخۆی بخۆ قەڵەو بە، بۆ کاری بێگار پتەو بە، ئەبینی؟

هیچ. ئەژنەوی؟ هیچ. چدەبینی؟ بەژن و باڵای ڕێکی ئاغا، لە وەتاغا. لە قۆناغا، ژن و ئەسپ و سامانەکەی، جامانەکەی، تەشك و داو و دامانەکەی.

چدەژنەوی؟ : لاف و گەزاف و چاووڕاو، باسی گۆشتاو، باسی پلاو.. چەند شات و شوت. گفتی چروك، قاقای بلحانە، قسەی سوك.

خۆت خەریك کە بە دەرەوە، بە تەنیا هەر بیرمەکەرەوە، تێمەگە چۆن دزی دەکا، گزی دەکا، دێ و دەچێ بێ هەست و چرپە، بەبێ خورپە، وەکو مام ڕێوی، وەك گورپە...

لە جوجەڵان دەرفەت دێنێ، بیرو مێشکیان لێ دەڕفێنێ، بە کەیفی خۆی ڕایان دێنی.

* * *

ئەگەر گەورەکان تێناگەن، مێشکیان بەتاڵەو پێناگەن، با لاوەکانمان وشیار بن، دوژمن بناسن، بەکار بن، با هاوکار بن، لەلاسایی خۆ رزگارکەن.

لە داگیرکەر خۆ قوتار کەن. با ئازاد بن، با ئازا بن، پیاوی خۆ بن، پیاوی خوا بن. لە هەق خوازی ڕانەوەستن، تەنیا پشت بەخوا ببەستن، هەر یەکە شیاوی پەرستن! هۆی بون و مان ئەو یەکەیە، ئیتر هەرچێکی تر هەیە، خاڵە لەپەنا ئەو یەکە خاڵ و سیفری بێبڕانەوە.

عەلی رێبوار

# یەك ...
## لەپەناخاڵ و سیفر بۆ برانەوە

یەکێ هەبو،
یەکێ نەبو،
جگە لە خوا هیچ کەس نەبو...
هیچ هەر نەبو،
ئەو خوایە تاك و تەنیا بو،
دلۆ وان و دلاّ وابو
دەیدی، دەی بیست،
جوانی دەویست،
وازی لەکاری ڕەوابو
بێکاری لا پەسند نەبو
نالەباری پێ ڕەند نەبو
لە نەبون خۆشی نەدەهات،
حەزی دەکرد لە بون، لەهات.
خودا لاگیری هونەر بو،
دروسکار و داهێنەر بو
با بزانین ئەو خوایە چی کرد؟
هەوری سازدان گەواڵ گەواڵ
بەری دانە هەوای بەتاڵ

گەواڵە هەوری لەچی کرد؟
لە دەنکە تۆزقاڵی زۆر ورد
ئەو دەنکە تۆزقاڵەی کۆمن
وردیلەی هێزی ئەتۆمن
هەر وردیلەی خۆرێک لەناو
بە ئەستێران دەورەدراو
لەو خۆرە چەرخ و خولیانە
سروەی تەکاندەر ئەنگوتن
گەواڵە هەور بزوتن
وەک چی؟
وەک دوکەڵ وەک گێژاو
وەک گێژەڵوکەی زۆر بەتاو
ئاورینگی هێنان بە گوڕبو
بەرهەمی بڵێسەو گڕبو
گڕ کۆوەبو لە دەوری خۆی
بنیادەم ناوی لێنا: ڕۆ
رۆژیش ئەتۆمی گەورەیە
چەند ئەستێرەی لەدەورەیە
بەدەوروبەریا خول ئەخۆن
هەر خوا دەزانێ چەند و چۆن
*　　*　　*

بناغەی ژیان دامەزرا
لە زەریا، لەبەژ، لە مەزرا،
قەوزە ڕوا، گیا دەرکەوت
دەوەن دەرهات، دار سەرکەوت
چڵمۆکە گیانی هاتە بەر
دنیا پڕ بو لە جانەوەر
جانەوەرێکیان مرۆیە
هەنبانەی ڕاست و درۆیە
چاکیان هەیە لە باش چاتر
هەیشە لە شەیتان خراتر
* * *
ژین لە چیە؟ ئاوێک، تۆوێک،
تۆمی گیایەک لەژێر خاکا، زۆر هەڵناکا، سەر دەردێنێ،
شین دەنوێنێ، بەخۆدادێ، دەبێتە چڵ، دەبێتە گوڵ...
ئەمام دەبێ بە شەنگەدار، گەڵایە، لکە، میوە و بار
پیر دەبێ، وشک ئەبێ، ئەپوێ
لەتۆوەکەی هی تر دەڕوێ
دڵۆپێک ئاو:
پزە، ساوایە، منداڵە، لاوە سەرەیە، پاتاڵە
لە هەڵسوڕ و داسوڕدایە
ئەویش وێنەی دارو گیایە
چرای ژینی دەکوژێتەوە
لە خاکا سەر دەنێتەوە

تۆمەکەی هەڵ دەداتەوە
ژیان دەس پێدەکاتەوە
ژیانیش هەر لە خول دایە
ئاوات و نیاز خۆریەتی
گیاندار یەکێ یان هەزاران
لەرێی ژین و بوژانەوە
ساڵ و مانگ بەبێ سانەوە
بەدەوریدا سەرگەردانن، وچان و پشو نازانن
دەڕوێن، دەڕۆن، دەڕوێنەوە
دەگوێن، دەپوێن، دەتوێنەوە.
* * *
یەکێ هەبو،
یەکێ نەبو
جگە لەخوا هیچ کەس نەبو،
هیچ هەر نەبو،
دنیا لە نەبو هاتە دی،
هەوای بەرز، زەوی نەوی
رۆژ و ئەستێرەی بێژمار
بەرەی گیاندار و گیاو دار
نەدیار و بەرچاو هەرچی بون
بێوچان و پشون، دەبزون
بەرەو کوێ؟
بەرەو مردن و ژیانەوە

وشك بون و هەڵدانەوە
ڕۆژ و شەو تاریك و ڕونی
گەش و سیس، بون و نەبونی
بەرزایی، نزمی، کەم و زۆر
کەوتونە خول لە دەوری خۆر
*    *    *

یەکێ هەبو
یەکێ نەبو
جگە لەخوا هیچ کەس نەبو،
هیچ هەر نەبو،
گەمیەی جیهان لەنگەری گرت
خانوچکەی ژیان سەری گرت
زەوی، عاسمان، توێ لەسەر توێ
پانایی لەکوێ هەتا کوێ
بێگیان و گیاندار گچکە و زل
زەمەند و مێرگ و پنج و قل
وردیلەو درشتە و ناوەند
ڕوبارو دەریای خۆر و مەند
کورت و درێژ و پەل و قوڵ
بێوچان کەوتنە جم و جوڵ
هیچی وچان نادا تاوێك
خول دەخۆن بەرەو هەتاوێك
*    *    *

تۆ بڕوانە:
هەمو شتی ئەم جیهانە
ئەگەر سرە، ئەگەر چڕە
ئەگەر والآ، ئەگەر پڕە، گشتی خڕە
مانگ و خۆر، زەوی، ئەستێرە
هەزار هێندەی تۆ بژمێرە
ئاتۆم، گلوی خوێن، تۆم و بەر
بژمێرە لەهەرژمار بەدەر
گەر بە پەلەن، گەر لەسەرخۆن
جەغزا و جەغز دێن و دەڕۆن
خاك و ئاو بەشار و دێوە
ئەگەر دەشتە، ئەگەر کێوە
ئەگەر گیا، ئەگەر گیاندارە
شەو و ڕۆژ سبەو ئێوارە
هەمو دەم و کات و ساتێك
هەمو چاخێك، هەمو کاتێك
بەساڵ، بەمانگ بە ڕۆ بە شەو
جەغزا و جەغز کەوتونە ڕەو
ڕوبە هەتاوی خۆرێکن
گشتیان لە خولدان جۆرێکن
* * *

یەکێ هەبو،
یەکێ نەبو،
جگە لەخوا هیچ کەس نەبو،
هیچ هەر نەبو...
بڵند هەبو، نەوی هەبو
عاسمان هەبو، زەوی هەبو
ئەستێرەی زۆر و مانگ و خۆر
هەزاری نادیار و پەیدا
لە بەتالآیی بێ پەیدا
کۆمایەکیان پێک هێناوە
لای ئێمە مەنزومەی ناوە
مەنزومەی تریش زۆر زۆرن
کۆمەڵگای ئەستێرەو خۆرن
چەندن؟ هەزار؟ نەخێر، ملیار؟
زۆرترن. ناهێنە هەژمار
فەزا زۆر پان و بلآوە
ئافەریدەش بێحەساوە
هەردی مە، یەک لەو کۆمەیە
تنۆکەیەک لەو گۆمەیە
* * *

ئەگەر تۆ بە ژمارە فێری
ئەتەوێ خواکرد بژمێری؟
قاقەزێکی درێژ ڕاخە
بە ئیشتیا شانی لێداخە
یەک بنوسە، بیکە بە دە
بیکە بە سەت، وچان مەدە
بیکە بە هەزار، بە ملیار
خاڵ دانێ بەهەزار هەزار
قاقەز برا هی تر بێنە
بە خاڵانی بنەخشێنە
هەڵچۆڕا ئەم مەرەکەوە
مەرەکەوی تر بگرەوە
تا دەتوانی خاڵ دانێ، خاڵ
مەپسێنەوە بە مانگ بە ساڵ
تۆ ماندو بوی بیدە بە من
هەزار هاوکاریش هەر کەمن
بێوچان خۆت و هەزاران
بەشەوگاران، بەڕۆژگاران
هەمو دەم هەمو کاتی ساڵ
لەپەنا یەک خاڵ ڕیز کەن خاڵ
خەو دایگرتی؟ یان نانت خوارد؟
لە خاڵ ڕیزکردن خۆتت بوارد؟



با کوڕەکەت، با نەوەکەت
بچن لە شوێن کردەوەکەت
خۆت و هاوکارانی پیرت
هاوسەفەری زەمین گیرت
بۆ گەمەی وەخت ڕابواردن
خەریک بن بە خاڵ بژاردن
هەر یەکەو خاڵی بێبڕانەوە
گێژ دەبن لە لێک دانەوە

* * *

پیری لەرزی لەکارکەوتو
زۆر هانی لەجێدا خەوتو
بێکار وەرکەوە بیرکەوە:
خۆت خاڵی بەپاڵ یەکەوە
دێتەوە بیرت مناڵ بوی؟
شلک و ساوا، کرچ و کاڵ بوی؟
تاوێک لەسەر سنگ ئەخزی
دەگریای لەبەر وەڕەزی
دەس بەڕەوڕەوە، دەگەڕای
بەدەس هەڵگێر و وەرگێر دەکرای
زل بوی، فێربوی خاڵ ببژێری
لەکاروبار خۆ ببوێری
گەورەتر ئاگایان لێت بو

دای و باب هیوایان پێت بو
پلەپلە بەرەژور چوی
پێت نایە سەتەوە، پیر بوی
چویتەوە دەقی منداڵی
نە بەگە و شلی و بەتاڵی
هەتا ساواو لەبەرچاو بوی
گەمەجاڕی دای و باو بوی
ئێستا لەپاش دەیان ساڵان
بویتە گەپجاڕی منداڵان
خوێن شیرنۆکە بوی بەکاڵی
ئێستا منداڵی خوێنتاڵی

* * *

ڕاکشێ، داکشێ، بیرکەوە، بیر
پێشتر چبوی مناڵی پیر؟
ژن و پیاگێ پێک گەیشتن
بەچاو، بەدڵ تێک گەیشتن
دڵۆپێک لەو، تنۆکێک لەم
لەناو پزدانێک کران جەم
تێکەڵاو بون بۆ تەواوبون
گورا ئیسقان و گۆشت و هون
نۆ مانگ نۆ ڕۆژ و نۆ سەحات
چاوەچاو بوی تا نۆرەت هات

ئەتۆش وەكو جوجیلەی مەل
مایتەوە تا هەڵ كەوت هەل
تۆكڵت شكاند پەردەت دڕاند
بەرەو ژین لەمپەرت پەڕاند
تۆ لە جوچك بێهێزتر بوی
بێدەرەتان و پێزتر بوی
ئەو دێتەدەر بە جوكەجوك
بۆ دان ئەكوتێ پەل و دەندوك
بەڵام تۆ: پلەگۆشتێ شل
نە پەل، نە مل، نە گوڕ، نە تل
چاو نەپشكوتو، گوێ نەبیس
تەوەزەل، نەگریس، سیس و پیس
لەناو بێشكە قەتیس و گیر
مڵچەی لێوت دەهات بۆ شیر
زیقەت دەهات شیرت دەویست
دەگریای، دەبنە خۆت دەمیست
ئێستا چی؟ لەپاش سەد ساڵی
چویتەوە دەقی منداڵی:
چاو نابینێ، گوێ ناژنەوێ
دانت نەما، شیرت دەوێ
یەخسیری لەناو جێگادا
مۆغەرەت زەوی بەرنادا

لە وەرەزیان ئاغڵەب خەوتوی
بێهێز و پێز، لەکارکەوتوی
هەر سێ کارت ماوە لە ژیان:
خواردن و رێنەوەو گریان
*     *     *
وادەی کۆچە
گەرەک سازدەی ساز و بەرگ
بۆ کوێ بەخێر؟ بەرەو مەرگ
لەخاک رواوی، سەد ساڵ ژیاوی
دەچیەوە ناو خاک خاکاوی
دەپوێی، دەرزێی، دەبیەوە خۆڵ
با دەت پرژێنێ لە چیاو چۆڵ
بە رواڵەت هیچت نامێنێ
بەڵام گڵت گیا دەروێنێ
ژین برانەوەی بۆ نی‌یە
باسی من من و تۆ نی‌یە
تۆش و زەویش و بەهاریش
بەگیان، بێگیان، بەرو داریش
ئەستێرە، عاسمان، مانگ و خۆر
دەبن، دەچن، بەهەل، بەنۆر
هەرچی ناوی ئافەریدەس



بەرچاوە یا دورە دیدەس
گشتی لەسورِ و خول دایە
ون دەبن و دێنەوە کایە
تۆ، تۆ، مرۆی پواوی ناو خاك
ئەگەر کارچاك بی و ژیان پاك
بەناوی چاکت هەر ماوی
بە یەکجاری نەفەوتاوی

* * *

وەرە رِونێ منالَی پیر
بۆی رِامێنە، بیرکەوە، بیر
ژمارەی مەنزومە چەندن؟
ئەستێرەکان چەند ئەوەندن؟
یەك و خالَ دانێ هەزاران
بە ملیۆنان، بە ملیاران
بە بست، بە گەز
بە غار، بە بەز
بە مانگ بە سالَ
خالَ دانێ، خالَ
رێزیان بکە، بیانکە هاوێر
دەتوانی بیژمێری؟ نەخێر...
قاقەز بێنە بە تۆپ، بەبار
مەرەکەو بە تەشت، بە تەغار

بنوست دارە، قامیشە؟
دادە بەباقە، بە گیشە
بنوسە، خەت دە، خاڵ دانێ
کێ دەتوانێ، هەموی رانێ؟
ژمارەی مەنزومە چەندن؟
ئەستێرەکان چەند ئەوەندن
گیاوگژ، هەواو کژ، مەل و مور
خزۆك و گەزۆك، نەرم و زور
چرۆ، مرۆ، نەوی، بەرز
لەبار، دزێو، ناحەز، تەرز
هەرچی لەم سەرزەمینەیە
چی لەو عاسمانە شینەیە
چی لە دەریا، چی لە بەژە
چی لە دەشتە، چی لە کەژە
چی دیارە، چی بەرپیوارە
چی بەگیانە، چی گیاندارە
بون، نەبون، مەرگ و ژیانەوە
ڕێزێك سیفرن بێبڕانەوە
لەپێش یەکێ ریزکراون
یەك نەبێ گشتی بێباون
* * *

بڕوانە چۆنە ئەو یەکە
ئەو هەمو سیفرەی لەتەکە
وشەی سیفر واتا بەتاڵ
بێ یەک بێکارن نوختەو خاڵ
یەک هەیە خاڵ دێتە ژمار
یەک دەکا بە هەزار ملیار
دو، سێ، چوار، پێنج و شەش و حەوت
هەشت، نۆ، دە، هەرچەندی سەرکەوت
زنجیرەی دەیان سەروخوار
سەت سەت تا دەگەن بە هەزار
هەموی هەر یەکە و چەند خاڵێک
هەموی وەچ و بەرەی ماڵێک
خاوەن ماڵ یەکە، یەک: سەرە
چەند سیفر و خاڵی لەبەرە
بێ یەک هەمو شت بەتاڵە
کێڵگەی قاقڕە، کراڵە
یەک باقییە، باقی پوکە
سیفر بەتاڵەو چەغزوکە
بە دەور خۆیا دەخولێتەوە
بەرەو خۆی دەگەڕێتەوە
بزۆز بێ یان بدا هەدا
ناچار سەر لە بۆشی ئەدا

هەر پوچە تا بێ هەواڵە
سیفر جەغزێکی بەتاڵە
تا تەکە زۆر بێ برەوە
لەگەڵ یەک هێژا و پتەوە
خاڵ با لای یەک پاڵ داتەوە
هیچ گا خۆی دور نەخاتەوە.

*   *   *

تۆ، تۆی منالی، دوێنێ کاڵ
تازە پێت ناوەتە ناو ساڵ
تۆی تازە لاو، بە گوڕ و تاو
لەخاک دەرچوی، لەخۆڵ گوراو
هیچ بوی، خاڵی ناو بەتاڵ بوی
جوان بوی، زۆر شەنگ و شەپاڵ بوی
بژی، بژی.. تا پیر دەبی
سەد ساڵەو زەمین گیر دەبی
دەبیەوە منداڵی دوێنێ
منداڵێک ریش دەبزوێنێ
بۆ کوێ دەچی؟ دەبێ بمری
مزڵ[1] لە توێی خاکا بگری
ئەبیەوە خۆڵ، ئەبیەوە گڵ

---

1 لە چاپە نوێیەکەدا لەجیاتی (مزڵ) نوسراوە (مەنزڵ) کە هەردوکیان یەک مانا دەبەخشێ

نم دەکێشی دەبیەوە چڵ
پنج و لاسکت دەڕوێتەوە
سیس دەبێ و دەوەرێتەوە
گێژی لەم چەرخ و خولەت دا
چی دێ بەم بیرە کولەت دا؟
هیچ بوی، سیفر بوی، بەتاڵ بوی
کاڵ بوی، داتولای، ژێر چاڵ بوی
هەزار جار بچی و بێیەوە
سەد جار سیس بی و بڕوێیەوە
تا خاڵی بە تەنیای[٢] والای
لە دەورەی بەتاڵی هالای
بەلام ئەگەر شوێن یەک کەوی
هەرچی خۆت پێت خۆشە: هەوی
نیشانەی لەگەڵ (یەک)ا بونت
بەڵگە بۆ دەراوی ڕونت
گەرەک خۆت لەبیر بەیتەوە
ئاوڕ وەخۆت نەدەیتەوە
بژی بۆ خزمەتی خەڵک

---

[٢] لە چاپە نوێیەکەدا لەجیاتی (بەتەنیا) نوسراوە (بەرنیا) کە گاسنێک کەمێک کول بوبێ پارچە ئاسنێکی داوێنە سەری و تیژی دەکەنەوە. (ئەمە بەپێی فەرهەنگی کوردستان، بەلام لە فەرهەنگەکەی هەژاردا نی‌یە)



**ببی بەخاڵی بەکەڵک**
**تۆ، تۆی نەمام و لاو**
**وازبێنە لەبیری بڵاو**
**ئاڵقەی جەغز، یەک لاکەوە**
**ببە ڕێگە، وەچیا کەوە**
**سەر دەرخە لە ئاوەدانی**
**تا تامی ژیان بزانی**
**ببە بە جۆبار، بەڕوبار**
**پاراو کە مەزرای چەند هەژار**
**ئەوسا دەڕژێیە دەریاوە**
**بۆ ژیان دەبیە سەرچاوە**
**تۆ کە ژیای بۆ داماوان**
**بۆ هەژاران، زۆر لێکراوان**
**ڕۆژ لە ڕۆژێ بڵند تری**
**لای خەڵک و خوا پەسندتری**
**بەس سیفرۆکەی جەغزوکەبە**
**شەپۆل بە، گێژەڵوکە بە**
**با گورەت بێ، بگرمێنە**
**دڕک و پیسی ڕاڕافێنە**
**هەڵەموت بە لەناو چیا**
**دار بەڕو بە لەناو گیا**

بەڵێ گیانە

باش بزانە

ئەوی لەکارە هەر یەکە

بێ حەساو سیفری لە تەکە

ئەستێرەی زۆر، زۆر مانگ و خۆر

عاسمان و زەوی کەم و زۆر

هەرچی لەو ناوەدا هەیە

هەر شتێ ئافەریدەیە

سیفرەو هەر یەکێ حەساوە

گش بەو یەکەوە لەباوە

(یەکێ) و سیفری بێبڕانەوە

وەك زانیوتە بیزانەوە

*    *    *

یەکێ هەیە

یەکێ نیە

جگە لەخوا هیچ کەس نیە

هیچ هەر نیە

*    *    *

خوێنەری بەرێز

لەوانەیە چەند وشەیەکی ناو ئەم نامیلکەیەت بەلاوە ئاشـنا نـەبێ، دەتوانـی لـەم فەرهەنگۆکەدا بۆیان بڕوانی:

| | |
|---|---|
| بنوس : | قەڵەم |
| بۆش | بەتاڵ |
| بەژ | وشکانی |
| پاتاڵ | لەکارکەوتە |
| پەز | بێچوی ناو زگ (جنین) |
| پزدان | منداڵدان (رحم) |
| چڵمۆکە | مادەی هلیومی |
| خاڵ | نوختە، سیفر |
| دلاوا | بەخشندە (رحمن) |
| دلۆوان | خاوەنی بەزەیی (رحیم) |
| ڕواڵەت | بەرچاو (ظاهر) |
| ڕونێ | دانیشە |
| شەپاڵ | جوان و نازەنین |
| فەزا | بۆشایی هەوا |
| قاو | بانگ، گاز |
| کژ | هەرەمە (موسم) |
| لاوەکی | غەوارە، خارجی |
| مەنزومە | ڕۆژ و ئەو ئەستێرانەی سەر بەون |
| نامۆ | بێگانە |
| نەبەگە | شل و ول و خۆنەگر |
| والا | بەتاڵ، بۆش |
| هاوێر | هەلا واردن |
| هون | خوێن |
| هێژا | بەنرخ |

هەرچەندە ..

ئەم شاکارە ناوازەی دکتۆر عەلی شەریعەتی
شایستەیە ، کە لە نیشانە درەوشاوەکانی
هزروبیری مرۆڤایەتی دابنرێ ، بەڵام بەرچەقترو
داڕشتنی هەژار موکریانی بۆ ئەم بەرهەمە بژاردەیە
پارچەیەکی بێ وێنەی کلتووری ئەدەبی کوردییە.
هەربۆیە شایانە ، گەورە و بچووک ، لەبەری بێننەوە..؟

ژمارەی سپاردن (٧٧) ساڵی ٢٠٠٤